




# گۆڤاری مێژووناسی

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە

ژمارە (3) پایز 2022، ساڵی یەکەم

لەلایەن کۆمەڵێک لە پسپۆڕانی مێژوو
بە هاوبەشی لەگەڵ زانکۆی جیهان دەردەچێت

# خۆراکی سەربازان لە ڕێکخستنی هەڵمەتە سەربازییەکانی عوسمانییدا (١)

نووسین: ئۆراڵ ئاتەش

وەرگێڕانی لە تورکیەوە: کامەران عبدالرزاق برایم

زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر / کۆلێژی ئاداب – بەشی مێژوو

KAMARAN.BRAIM@su.edu.krd

## هەڵسەنگاندنی وەرگێڕ:

ئەم توێژینەوەیە دەربارەی چیەتیی خۆراکی سەربازان، ماددە خۆراکییە بەکاربراوەکان و چۆنیەتی دابینکردنی خۆراك بۆ سەربازان لە کاتی هەڵمەتەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا نووسراوە. توێژەر (ئۆراڵ ئاتەش) ئەم توێژینەوەی لە قۆناغی دکتۆرا لە بەشی مێژووی زانکۆی (چانکری کەرەتەکین) نووسیوەو لە ئۆکتۆبەری ٢٠٢٠ لە گۆڤاری فاکەڵتی ئادابی هەمان زانکۆ (KAREFAD, ÇKÜ Edebiyat Fakültesi Dergisi, Cilt: 8, Sayı: 2, Ekim 2020: 286-316.) بڵاوی کردووەتەوە.

توێژەر هەوڵیداوە توێژینەوەیەکی گشتگیر بنووسێت دەربارەی خۆراکی سەربازان لەکاتی هەڵمەتە سەربازییەکان بە درێژایی مێژووی دەوڵەتی عوسمانی، بۆ ئەم مەبەستەش سوودی لە ژمارەیەکی زۆری سەرچاوەکان بینووەو توێژینەوەیەکی ئاست بەرزی خستووەتە بەردەست. لەگەڵ ئەوەشدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە نا هاوسەنگیەك هەیە لە داڕشتنی تەوەر و زانیارییەکاندا، بۆ نمونە هەڵمەتە سەربازییەکانی ٦٠٠ ساڵی دەوڵەتی عوسمانیی لە چوارچێوەی یەك تەوەری گشتگیردا باسکردووە، لە بەرامبەردا دوو تەوەری ووردی بۆ جەنگەکانی ساڵانی ١٩١٢ تا ١٩١٨ تەرخان کردووە. هەرچەندە گومان لەوەدا نیە کە نەبوونی سەرچاوە و زانیاریی پێویست هۆکاری سەرەکی ئەم جۆرە داڕشتنەیە، بەڵام دەبوو ووردتر لە ئەرشیفی عوسمانیی قوڵ بێتەوەو زانیارییەکانی تەوەرەی یەکەم دەوڵەمەندتر بکات. هەروەك تێبینی ئەوەش دەکرێت کە لە هەندێك شوێندا بەیەك بەستنەوەی گونجاوی نەکردووە بۆ زانیارییەکان کە لە سەرچاوەی جیاواز وەری گرتووە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەتوانرێت بگوترێت ئەم توێژینەوەیە کەلێنێکی گرنگی لە مێژووی عوسمانیی پڕکردووەتەوە و زانیاریگەلێکی نوێ و گرنگی خستووەتە بەردەست.

## پوختە:

هەرچەندە سوپاکان لێهاتوویی جەنگان و توانای جوڵەیان باش بێت و باڵا دەست بن لە هەبوون و بەکارهێنانی چەکدا، ئەگەر لەڕووی توانای لۆجستیەوە کەموکوڕییان هەبێت سەرکەوتنیان زۆر ئەستەم دەبێت. خزمەتگوزاریی و دابینکردنی خۆراك و خواردەمەنیش لە کەرەستە سەرەکییەکانی لۆجستی سەربازگەکانن، بەدرێژایی مێژوو خزمەتگوزاری دابینکردنی خۆراك یەکێك بووە لە هۆکارە سەرەکیەکانی بەدەستهێنانی سەرکەوتنی سوپاکان لە گۆڕەپانی جەنگدا. بە پێدانی خۆراکی باش و تەندروست بە سەربازان، هێزی جەنگانی سوپا زیاتر دەبێت. لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانییشدا بەهەند وەرگرتنی خۆراکی سەربازان پشکێکی گەورەی هەیە لە سەرکەوتنی هەڵمەتەکانی فەتحکردندا.

دەوڵەتی عوسمانیی بە دامەزراندنی بنکەی تایبەت بە پشوودان و دابینکردنی خۆراکی سەربازان (teşkilâtı menzil) بووەتە نمونەیەك بۆ دەوڵەتانی هاوسەردەمی خۆی. لەم دەوڵەتەدا خزمەتگوزاریی دابینکردنی خۆراك بۆ سەربازان هەر لەسەرەتای دامەزرانیەوە تا لەناوبردنی یەکەکانی یەنیچەری(سوپای نوێ)، لەلایەن چەند گروپێکی خزمەتگوزار و پیشەوەران بەناوەکانی (ئۆردوجو، ئۆردوجو ئێسنافی، ئێهلی هیرەف) ئەنجامدراوە. لەساڵی ١٨٢٧ یاسایەك دەرچووەو بەگوێرەی ئەوە دەوڵەتی عوسمانیی بەرپرسیارێتی دابینکردنی تەواوی پێداویستیەکانی سەربازانی لە کاتی ئاشتی و جەنگدا گرتووەتە ئەستۆ و دەستی کردووە بە ڕێکخستنیان. بەگشتی لە ڕێکخستنەکانی هەڵمەتەکانی عوسمانییدا ئەندازە و ماددەی ئەو خۆراکانەی کە سەربازان خواردوویانە بەگوێرەی دووری شوێنی هەڵمەتەکە، ڕێڕەوی هەڵمەتەکە و هۆکاری تری جۆراوجۆر گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە. ئامانج لەم توێژینەوەیە بریتیە لە دەرخستنی چۆنیەتی ئەنجامدانی دابینکردنی خۆراکی سەربازان لەمیانەی ڕێکخستنەکانی هەڵمەتەکانی عوسمانی و ڕوانین لەو هەڵمەتانە لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە.

کلیلە وشە: خۆراکی سەربازان، ڕێکخستنی هەڵمەتە سەربازییەکان، سوپای تورك، عوسمانیی، لۆجستی.

## دەروازە:

لەکاتی لێکۆڵینەوە لە جەنگەکان هەر لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، دەردەکەوێت کە دابینکردنی خزمەتگوزاریی لۆجستی یەکێکە لەو هۆکارە سەرەکیانەی کە کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر توانا و جولە سەربازییەکان. لەگەڵ دەسپێکی دەرکەوتنی چەکی ئاگرین و گۆڕانی شێوازەکانی جەنگ، پێداویستیەکانیش گۆڕاون و جۆراوجۆرتر بوون. لەنێو ئەو جۆراوجۆرێتیەشدا خۆراکی سەربازان بووەتە سەرتۆپی خزمەتە لۆجستیەکان. فەرماندەکان، خۆراکی باشی سەربازانیان وەك مەرجێك بینیووە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا. ووتەکەی ناپلیۆن بۆناپەرتیش «سوپاکان لەسەر گەدەیان دەڕۆن» نمونەیەکی بەرچاوی ئەو ڕوانگەیە. هەروەك لە کتێبی (کوتادگو بیلیگ[٢])یشدا نووسراوە پێویستە خۆراك، ئەسپ وچەکی سەرباز فرە بێت، ئەمانە مافی خوێ و نانی (مافی سەرەتایی) شەڕڤانن، شەڕڤان ئەمە لەبیر ناکات و هەموو هەوڵێکی دەخاتەگەڕ بۆ بەدەستهێنانی ئەو مافەی. هەر لە هەمان کتێبدا ئەرکی فەرماندەکانی بەو شێوەیە دیاری کردووە «بەگ، پێویستە ئەو ماڵ و دەسکەوتانەی کە لە جەنگدا بەدەستی هێناوە دووبارە بەسەر ئازاکاندا دابەشی بکات، پێویستە خواردن و خواردنەوەیان پێ بدات. ئەگەر سامانەکەی کەمی کرد دەبێت ئەو کورتهێنانە بە دەسکەوتەکانی جەنگ پڕ بکاتەوە، لەکاتێکدا بەدەستی ڕاست شمشێر دەوەشێنێت و دەپێکێت، دەبێت بە دەستی چەپی سامان دابەش بکات، هاوبەشیی پێ بکات.»[٣]

بەگشتیی مادده خۆراکییەکانی وەك گۆشت، ڕۆن و ئارد خۆراکی سەرەکی تورکەکان بوون، بە تێکەڵکردنی ئەو ماددانە یان بە زیادکردنی ماددەی تری خۆراکیی بۆ سەریان چێشتیان دروست کردووەو لە ئاردیش نانی شێوە جیاوازیان برژاندووە. نانەکانیش بەگوێرەی چۆنیەتیی برژاندن و شێوەیان. ناوەکانیان گۆڕاوە. نانی تیریی (Yufka) بەربڵاوترین جۆری نان بووە کە تا ئێستاش گرنگی خۆی پاراستووە. بەدوای نانی تیریدا جۆرەك هاتووە کە هەندێك لە کولێرە دەچێت. لەبەرئەوەی سەربازانی تورك زۆربەی کاتەکانیان بەسواری پشتی ئەسپ بەسەر بردووە، ئەو خۆراکەنەیان پەسەندکردووە کە ئامادەکردن و نوێکردنەوەیان ئاسان بووە. ئەو خۆراکەی گۆشتی تێدا بەکار نەهاتبێت بە (چێشتی بێ تام) ناویان بردووە. هەمان دەستەواژە بۆ ڕۆنیش بەکارهێنراوە. دەوڵەمەندیی چێشتەکان لەڕووی ماددەی خۆراکیی کاریگەریی هەبووە لەسەر بەهێزبوونی پێکهاتەی جەستەییان.[٤] هەرچەندە ژینگە و کات زۆر سەختیش بووبێت، تورکەکان ڕێگایەکیان دۆزیوەتەوە بۆ ئاسان دابینکردنی خۆراك و پێداویستیەکانیان. نزیکەی ٥٠٠ تا ١٠٠٠ ساڵ پێش دەرکەوتنی گۆشتی لەقوتوونراو لە چین و ئەوروپا، تورکەکان شارەزای ئامادەکردنی ئەم جۆرە گۆشتەبوون و لەکاتی جەنگدا سوودێکی زۆریان لێ وەرگرتووەو بەکاریان هێناوە، لەکاتێکدا سوپاکانی تر لەکاتی هەڵمەتەکانیاندا هەزاران سەر ڕەشەووڵاخیان بەدوای خۆیاندا هێناوە. هەندێك لە نووسەرانی لاتینی، باسیان لەوە کردووە کە (هوونەکان) و لە چەندین سەدەی دواتریشدا (مەجەریەکان) گۆشتی خاوی ووشکیان خواردووە (کە لە





ڕۆژگاری ئێستادا بە باسترمە ناو دەبردرێت) و لەو تورەگانە هەڵیانگرتووە کە بە زینەکانەوە بەستوویانەتەوە.[٥] بەگشتیی، لە هەڵمەتەکانی سوپای عوسمانییدا گۆشتی مەڕ یەکێك بووە لە سەرەکیترین مادده خۆراکییەکانی سەربازان، هەرچەندە بەگوێرەی سەردەمە مێژووییەکان گۆڕانکاریی بەسەر ئەندازەکەیدا هاتووە.

ئەم توێژینەوەیە کە دەربارەی دابینکردنی خۆراکی سەربازان لەمیانەی هەڵمەتەکاندا ئامادەکراوە، ئامانجی ئەوەیە کە هەر لە سەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی عوسمانیەوە چۆنیەتی دابینکردنی خۆراکی سەربازان و چیەتیی مادده خۆراکییە بەکاربردراوەکان بخاتە ڕوو. لەکاتی شەنوکەوکردنی سەرچاوەکانیش ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە نووسین و توێژینەوە دەربارەی ئەو بابەتە کەمە، ئەو کارانەشی کە ئەنجامدراون ماوەی دیاریکراو و بابەتی دیاریکراویان خستووەتە ڕوو. هەرچی ئەم توێژینەوەیە، لەوەتەی دامەزرانەوە تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیی بابەتی خۆراکی سەربازانی بەشێوەیەکی گشتگیر و یەکپارچە لەخۆوە گرتووە. گەڕان بۆ سەرچاوە بەردەستەکان ئەنجام دراوەو سەرچاوەو دیوکۆمێنتەکان کۆکراونەتەوە، زانیاریەکان بەشێوەیەکی سەرەکی لە بەرهەمە بڵاوکراوەکان، تێزەکان، بیرەوەرییەکان و توێژینەوە بڵاوکراوەکان وەرگیراون و دواتر زانیارییەکان هەڵسەنگێنراون.

### خۆراکی سەربازان لە سوپای عوسمانییدا تاوەکو جەنگی باڵکان (١٢٩٩-١٩١١):

عوسمانییەکان هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیانەوە وەك میرنشینێك بەردەوام توانای شەڕکردنیان زیادی کردووە، بەهۆی ئەوەی بەردەوام لە حاڵەتی شەڕدا بوون، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی ڕێکخستنەکانیان خەسڵەتێکی سەربازیی وەربگرێت. لە سایەی ئەو ئەزموونەی کە لەمیانەی ئەو پرۆسەیەدا بەدەستیان هێناوە، لە بابەتەکانی دابینکردن و خۆراك کێشەیان نەبووەو بەسەرکەوتوویی ڕێکخستنی هەڵمەتەکانیان بەڕێوەبردووە.[٦] عوسمانییەکان لەکاتی بڕیاردان بۆ ئەنجامدانی هەر هەڵمەتێك یەکێك لەو کێشانەی کە ویستوویانە چارەسەری بکەن بریتی بووە لە ئامادەکردنی ئازوقە بۆ خۆراکی سوپا و دابینکردنی ئالیك بۆ ئەو ئاژەڵانەی باریان پێ گواستووەتەوە. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانەش ئەوەیان لەبەرچاوگرتووە کە تێچووی هەڵمەتەکە لەسەر دارایی دەوڵەت سوك بکەن و بە کەمترین دەستوەردان لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵك خۆراکی سوپا ئامادە بکەن. سوپای عوسمانیی لەکاتی هەڵمەتەکاندا ئازوقەی گواستراوەی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووەو ئەندازەی زیادەی پێویستییەکانیش لەلایەن ناوچەکانەوە لە ئەستۆگیراوە.[٧]

کاروبارەکانی دابینکردنی پێداویستیی سەربازیی و خۆراك تا لەناوبردنی یەکەکانی یەنیچەری و دامەزراندنی سوپای مۆدێرن لە ساڵی ١٨٢٦، لەلایەن (یەکەکانی خزمەتگوزاریی تر) ئەنجام دراوە کە بەناوەکانی (ئۆردوجو) و (ئۆردوجو ئیسنافی) و (ئێهلی هیرەف) ناسرابوون.[٨] بۆ نمونە دوای دەرچوونی فەرمان و ڕوونبوونەوەی ڕێڕەوی هەڵمەت، (ئۆردوجو)ەکان پێش سەربازان بەڕێدەکەوتن و دەچوونە خاڵەکانی پشوودان و فڕنەکانیان دادەمەزراند، سەربازان لەکاتی گەیشتنیان بەشوێنەکە نانی تازەیان دەخوارد.[٩] هەرچی (ئۆردوجو ئیسنافی[١٠])یە بریتین لەو پیشەوەرە دیاریکراوانەی کە لە ڕێڕەوی سوپادا پێداویستییەکانی سەربازانیان دابین دەکرد و

بەشداریی هەڵمەتەکانیان دەکرد.[11] ئەم گروپانە لەپاڵ سەربازان بەشداریی هەڵمەتەکانیان دەکرد و نان و چێشتیان دروست دەکرد و پێیان دەدان. نرخی خواردنەکانیش لەلایەن یەکە سەربازییەکانەوە دەدرا.[12] بەگشتیی بایەخێکی زۆر بە خواردنی سەربازان دراوەو پرۆسەکە بە بەشداریی مەڵبەندی دەوڵەت(ئیستەنبول)، ڕێکخستنەکانی دەوروبەر و هاوڵاتیان لە شێوەی سەفەربەرلیك(نفیر عام)ێکی گشتیی جێبەجێکراوە.

کاتێك بڕیار لەسەر ئەنجامدانی هەڵمەتێك دەدرا، فەرمانی ڕێکخستن و خشتەی ڕێکردنی هەڵمەتەکە ئامادە دەکرا و بەگوێرەی ئەوە تا دەستپێکردنی جەنگەکە پلان دادەنرا. هەر هەڵمەتێکیش لە چوار قۆناغ پێکدەهات کە بریتی بوون لە: ڕۆیشتن بەرەو تۆپەڵبوون(تحشد)، تۆپەڵبوون، جەنگان و گەڕانەوە. خۆراکی سەربازانیش بۆ هەر یەکێك لەم قۆناغانە بەشێوەی جیاجیا پلانی بۆ دادەنرا[13] و هەژماردەکرا.[14] بەم شێوەیە دیاریی دەکرا کە کامە یەکەی سەربازیی لە کامە بنکە پشوو دەدات. ئامادەکردنی پێداویستیی و خۆراکی یەکە سەربازییەکانیش لە ئەستۆی ئەو قازییانە بوو کە دەکەوتنە ناوچەی سەر ڕێگای هەڵمەتەکە. لە فەرمانەکانی سولتاندا دەبینین کە ئەو قازییانەی ئەرکەکەیان جێبەجێ نەکردووە، یان کەمتەرخەمییان کردووە، بە توندیی سزادراون.[15] پێداویستییەکانیش لەژێر ناوی (ئاڤارزی دیڤانییە یان تێکالیفی ئۆرفییە[16]) وەك بەرپرسیارێتیەك دەخرایە ئەستۆی خەڵکی ناوچەکە. بەم شێوەیە لەکاتی هەڵمەتەکاندا یان دۆخی نائاساییدا لەڕێگای ئەم جێبەجێکردنەوە پێداویستیی سەربازان لەلایەن ناوچەکانەوە دابین دەکرا بێ ئەوەی ببێتە بارگرانی بۆ خەزێنەی گشتیی. دابینکردنی ئەو پێداویستییانەش بە سێ شێوەی جیاوازی (سورسات، نوزول و ئیشتیرا[17]) جێبەجێ دەکرا.[18] بەهۆی ئەوەی گواستنەوەی ئەو ئەندازە زۆرەی ئازوقە خەرجییەکی زۆری دەویست، لەڕێگای ئەم شێوازانە چینی (مێککارە[19]) ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە.[20] بەشێوەیەکی گشتی ئاژەڵەکانی وەك ئەسپ، ئێستر یان ووشتر وەك ئاژەڵی باربەر بەکارهێنراوە.[21] لەنێو ئەو ئاژەڵانەشدا زیاتر ووشتر پەسەندکراوە بەهۆی بەرگەگرتن و توانا زۆرەکەیەوە.[22]

مادده خۆراکییە بنچینەییەکانی وەك گۆشت، ئارد، گەنم، برنج، ساوەر، کەرە، هەنگوین، جۆ و جاودار(دانەوێڵەیەکی وەك جۆیە) بەسەر سەربازەکاندا دابەش دەکرا.[23] ئەو ماددانەش لە دەفتەرەکانی تۆماری ڕۆژانە (روزنامچە[24]) بەبێ دیاریکردنی ئەندازەکەی بەشێوەیەکی تەواو، خراوەتە ڕوو. لەبەرئەوە کارێکی زۆر زەحمەتە بتوانرێت پشکی خۆراکی هەر سەربازێك دیاریی بکرێت.[25] بوونی مادده خۆراکییەکان لە کۆگا و بنکەکانی سەر ڕێگای هەڵمەت بە ئەندازەی پێویست، بەرپرسیارێتیەك بوو لە ئەستۆی دەوڵەت. ئەو مادده خۆراکییانەی کە نەتوانراوە بۆ ماوەیەکی درێژ ئەمباریکرێن لە سەر ڕێگای هەڵمەتەکاندا دابین کراوە، ئەگەر یەکێکیش لەو ماددانە بەهۆی قاتیی و نەخۆشیی و ...هتد نەتوانرابووایە لە ناوچەکەدا دابین بکرێت، ئەوا لە ناوچەی ترەوە هەوڵی دابینکردنی دەدرا.[26] ئەو ئازوقانەش لەڕێگەی ڕێکخستنی بنکەوە [27] بۆ کۆگاکانی سەر ڕێگای هەڵمەت دابین دەکرا. ئەو بنکانە لە ڕێکخستنی هەڵمەتەکانی عوسمانییدا





لە ڕووی بازرگانیی، دابینکردنی خۆراك، گواستنەوە، ئامانجی شەڕکردن و کاروبارە سەربازییەکاندا ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕاوە.[28] لەمیانەی هەڵمەتەکاندا هەموو کات گرنگیی دراوە بە خزمەتگوزاریی خواردنی سەربازان و پڕبوونی کۆگاکان.[29] دەوڵەتی عوسمانیی لەسایەی ڕێکخستنی بنکەدا سەرکەوتوو بوو لە دامەزراندنی تۆڕێك لە کۆگا، دابینکردنی سەرکەوتووانە و خێرا لەچاو هاوسەردەمانی خۆی. هەموو ڕۆژێك دووجار چێشت لێ دەنرا بۆ پێدانی خواردن بە سوپا. ئەگەر ناچاریی نەبووبێت خۆراکی ووشك نەدراوەتە سەربازان و هەموو ڕۆژێکیش چێشتەکە نوێ کراوەتەوە. پێکهاتەی سەرەکیی چێشتەکە بریتی بووە لە گۆشتی مەڕ، هەرچی گۆشتی ڕەشەووڵاخە زۆر بەکارنەهێنراوە و گۆشتی مریشکیش بەڕێژەیەکی کەم بەکاربردراوە.[30] دەکرێت بگوترێت کە یەکێك لە هۆکارەکانی کەم بەکارهێنانی گۆشتی ڕەشەووڵاخ و پەسەند نەکردنی دەگەڕێتەوە بۆ جێبەجێکردنی خزمەتگوزاریی وەك بار و گواستنەوە لەڕێگەی ئەم ئاژەڵانەوە. ئاژەڵی گەورەو بچوکی وەك مەڕ و گا کە بەگشتیی سەرچاوەی گۆشتیان پێکدەهێنا، بەشێوەی زیندوو بەدوای یەکە سەربازییەکانەوە بوون و بەمەش توانراوە چێشتی گۆشتی تازە دابین بکرێت. ئەگەر لەو بوارەدا کێشە هەبووبێت ئەوا گۆشتی سوێر یان ووشککراوە دراوەتە سەربازان.[31]

بەگشتیی لە برنج و ساوەر، پلاو و شۆربا دروستکراوە. (گراف مارسیلی) کە ماوەیەکی زۆر لە سوپای عوسمانییدا بە دیل گیراوەو دوای ئازادبوونیشی لێکۆڵینەوەی دەربارەی دەوڵەتی عوسمانیی ئەنجامداوە، دەربارەی خواردنی سەربازانی عوسمانیی بەرهەمێکی نووسیووەو تێیدا باس لەوە دەکات کە خواردنەکان لە بەیانیان کاتژمێر ١١:٠٠ و ئێوارانیش کاتژمێر ٢٠:٠٠ لێنراون و دابەشکراون، هەفتانەش دووجار پلاو دابەشکراوە.[32] بەروبوومە دانەوێڵەییەکانیش لە خۆراکی سەربازاندا گرنگیەکی گەورەیان هەبووە. بەروبوومەکانی دانەوێڵە بەدرێژایی ئامادەکارییەکانی هەڵمەت لەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدا بووەو ڕێگا نەدراوە بۆ دەرەوەی ووڵات بنێردرێت.[33]

هەرچەندە هیچ تۆمارێکی یەکلاکەرەوە لەبەردەست نیە دەربارەی پشکی خۆراکی سەربازان لە هەڵمەتەکانی عوسمانییدا، بەڵام لە بەرهەمەکەی (گراف مارسیلی)دا ئاماژە بەوە دراوە کە ئەگەر لەکاتی هەڵمەتدا کاتیان نەبووایە بۆ نان برژاندن ئەوا پێکسیمەت[34] دەدرایە سەربازان، لەکاتێکیشدا ئەگەر نان برژێنرابووایە ڕۆژانە ١٠٠ درهەم[35] نان، ٥٠ درهەم پێکیسمەت، ٦٠ درهەم گۆشتی مەڕ یان ڕەشەووڵاخ، ٢٥ درهەم ڕۆن، ٥٠ درهەم برنج دەدرایە هەر سەربازێك (واتە ڕۆژانە هەر سەربازێك بڕی ٣٢٠ گم نان، ١٦٠ گم پێکیسمەت، ٢٠٠ گم گۆشتی مەڕ، ١٦٠ گم برنج و ٨٠ گم ڕۆنی پێدراوە).[36] (عومەر ئیشبیلیر) لە توێژینەوەکەی دەربارەی هەڵمەتەکانی ڕۆژهەڵات لەنێوان ساڵانی ١٦٠٣-١٦١٧ گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە موڕادی چوارەم لە هەڵمەتی بەغدا ٧٠٠ گم پێکیسمەت و ١٦٠ گم گۆشتی بەسەر سەربازان دابەشکردووە.[37] هەرچی (سەردار گەنج)ە لە توێژینەوەکەیدا دەربارەی لۆجستیی شەڕەکانی نێوان ساڵانی ١٧٢٢-١٧٢٥ ی عوسمانیی-سەفەویی باس لەوە دەکات کە لەمیانەی هەڵمەتەکانی ئێراندا، هەر سەربازێك

لە سوپای عوسمانیدا پشکی ڕۆژانەی گۆشتەکەی بریتی بووە لە ٢١٣ تا ٢٥٦ گم.[٣٨] لە شەڕی قرمی ١٨٥٣-١٨٥٦یشدا ڕۆژانە هەر کەسێك بڕی ٢٥٠ گم گۆشتی پێدراوە،[٣٩] هەرچی لە شەڕی عوسمانیی-ڕووسیی ١٨٧٧-١٨٧٨ ە، بڕەکەی بووەتە ٣٢٠ گم.[٤٠] لەو ڕووانگەوە دەتوانرێت بگووترێت کە لەوەتەی دامەزرانی دەوڵەتی عوسمانیی تا جەنگی باڵکان ماددەی بنەڕەتیی خواردنی سەربازانی عوسمانیی بریتی بووە لە گۆشتی مەڕ کە بەگوێرەی شوێنی هەڵمەتەکە، دوورییەکەی، ڕێگاکەی و توانای دابینکردن پشکی هەر سەربازێك لەنێوان ١٦٠ تا ٣٢٠ گم گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە.[٤١]

پێکسیمەت یەکێکی دیکە بووە لەو ماددە خۆراکییانەی کە لەلایەن سەربازانی عوسمانییەوە زۆر پەسەندکراوە بەهۆی ئەوەی بەخێرایی تێکنەچووە و بەرگەگر بووە، بەتایبەتی لەو شوێنانەی نزیك گۆڕەپانی جەنگ بوون.[٤٢] لە هەندێك حاڵەتدا پێکسیمەت دەبووە سەرچاوەی سەرەکی خۆراك و لەجیاتی نان بەکاردەهێنرا، بۆ نمونە ئەگەر هەڵمەتی سەربازیی لەماوەی پێشبینیکراو زیاتر درێژەی کێشابووایە، یان لەکاتی درەنگ دابینکردنی ئازوقە و لە حاڵەتی کورتهێنانیدا. هەروەها لەکاتی ڕۆیشتن و ڕێکردنی یەکە سەربازییەکان بۆ ڕێگریکردن لە زەحمەتییەکانی گواستنەوە بەشی هەشت ڕۆژ پێکسیمەتیان پێ دراوە.[٤٣] لەکاتی پێویستیشدا لە قەڵاکانی سەر سنوور پێکسیمەت ئەمبار دەکرا بۆ ئەوەی بەکاری بێنن.[٤٤]

هەرچی ئاوە، بەهۆی گرنگییەکەی بۆ تەندروستی سەربازان یەکێکە لەو بابەتانەی کە هەمووکات پێویستی بە لەسەر وەستانە.[٤٥] ئەو ئاوەی کە سەربازان بۆ خواردنەوە و کاری تر بەکاریان هێناوە، لەلایەن ئاوگێڕەکانەوە بە بارگین و لەنێو مەشکەی لە پێستە دروستکراو گواستراوەتەوە.[٤٦] بۆ دیاریکردنی بنچینە و یاسای دابینکردنی ئاو لە کاتی هەڵمەتەکاندا، چەند ڕێکخستنێك بەناوەکانی (سەقا، مەشك و سێیسهانەی مێککارە) ئەنجام دراوە.[٤٧]

دوای ڕێکخستنەوەی سوپا، دەوڵەت دابینکردنی خۆراکی سەربازانی لەکاتی ئاشتی و شەڕدا قبول کردووەو ستانداردێکی داناوە بۆ پشکی ڕۆژانەی خواردنیان. لەکاتی هەڵمەتەکاندا ئەندازەی خۆراکە پێویستەکانی وەك برنج، ڕۆن، خوێ، پیاز، سەوزەی ووشك، ڕۆنی زەیتون و ...هتد بۆ سەربازان دیاریکراوە. بەگوێرەی بارودۆخی دابینکردن قاوە، شەکر و سرکەش دابەشی سەر سەربازان کراوە. لەساڵی ١٨٧٢ هەژمارکردنی خۆراکی ڕۆژانەی سوپا بەم شێوەیە بووە: ژمارەی سوپا X زیادەی ¼ ی پشکی ڕۆژانەی هەر سەربازێك.[٤٨] هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی جۆری ئۆپەراسیۆنەکە ئازوقە دابینکراوە.[٤٩]

هەرچەندە ڕێکخستنە سەربازییەکانی عوسمانیی لە سەدەی ١٨ لە بابەتی خۆراکی سەربازان و سیستەمی کارەکەدا هەندێ کێشەی تووش هاتبێت، بەڵام تەواوی تایبەتمەندیەکانی سەردەمی کلاسیکی لەدەست نەداوە.[٥٠] ئەو کێشانەش زیاتر لە سەدەی ١٩ و لە جەنگی عوسمانیی-ڕووسیی ١٨٧٧-١٨٧٨ دا هەستی پێکراوە کە لە هەردوو بەرەی قەفقاس و باڵکان ڕوویداوە. لەو جەنگەدا هەر سەربازێك وەك ئازوقەی بەرگەگر





بەشی چوار ڕۆژ پێکسیمەتی پێ دراوە. جگە لەوەی وەك پشکی ڕۆژانەی خواردن ٦٤٠ گم ئارد، ٣٢٠ گم گۆشت، ١١ گم خوێ دابینکراوە. بەگشتی گۆشتەکە بەشێوەی تازە دراوە.[٥١] لەو یەکە سەربازییانەشی کە گەڕۆك بوون پشکی هەر سەربازێك بە ٩٦٢,١ گم نان هەژمارکراوە.[٥٢] لەکاتێکیشدا کە بەهەر هۆکارێك نەتوانرابێت نان بدرێت، ٦٠٠ گم پێکسیمەت دراوە. ئەگەر جگە لە پێکسیمەت هیچ ماددەیەکی تری خۆراکیی بەردەست نەبووبێت، ئەوا ئەندازەی ١٠٠٠ گم پێکسیمەت بۆ هەر سەربازێك بەگونجاو زانراوە. پێکسیمەتەکانیش بە قەبارەی قاپێکی شۆربا بەرهەمهێنراون.[٥٣] لەکاتێکدا کە نەتوانرابێت ساوەر بدرێت، سەوزەی لە قوتوونراو یان سەوزەی ووشك دراوە، ئەگەر نەشتوانرابێت سەوزەی تازە بدرێت ئەوا خۆراکە ووشکەکان و لە قوتوونراوەکانی وەك ئاردەکانی ترخێنە، بڕوێش، هەڕشتەی جۆ، میوەی ووشك، گەنم، نیسك، گەنمەشامی، نۆك و فاسۆلیا بۆ خواردن بەگونجاو زانراوە. هەندێك جاریش پێداویستیی گۆشت لە ڕێگەی گرتنی ماسی لە ڕووبارە نزیکەکانی نزیك گۆڕەپانی جەنگ دابینکراوە.[٥٤]

لەجەنگی ١٨٧٧-١٨٧٨ عوسمانیی-ڕووسیی لە هەردوو بەرەی قەفقاس و باڵکاندا زوو زوو کێشە دروست بووە لە گەیاندنی ماددە خۆراکییەکان بە سەربازان. ئەم دۆخەش زیاتر لە بەرەی قەفقاس دەرکەوتووە. سەربازەکان کە کێشەی خۆراکیان هەبووە، هەندێ کات هەوڵیانداوە بە بەروبومی کێڵگەکانی گەنمەشامی لە ناوچەکەدا برسیەتی خۆیان بڕەوێننەوە.[٥٥] ئەو بەشە خۆراکەی کە لەسەرەتای شەڕەکە پلانی بۆ دانرابوو زۆربەی کات نەتوانراوە بە سەربازەکان بدرێت، تەنها توانراوە نانێکی ١٤٠ درهەمی و ١٥٠ گم لە گۆشتی گا بدرێت، هەندێك جاریش شۆربا لێنراوەو دابەشکراوە.[٥٦] لە کۆتاییەکانی جەنگەکەشدا گۆشت بە تەواوی کەم بووەتەو پشکەکانیش کەم بوونەتەوە، ئەوەی کە سەربازان توانیویانە بیخۆن بریتی بووە لە ئەندازەیەك نانی گەنمەشامی و ئاردی گەنمەشامی.[٥٧] یەکێکی دیکە لەو ماددە خۆراکییانەی کە لە سەرەتا تا کۆتایی جەنگەکە کێشە لە هەبوونیدا دروست بووە بریتی بوو لە خوێ. هەرچی شەکرە هەرچەندە لە سەرەتای جەنگەوە کەم و زۆر دابەشکراوە، بەڵام لە کاتەکانی دواتری جەنگدا نەتوانراوە ئەویش بدرێت.[٥٨]

## خۆراکی سەربازان لە سوپای عوسمانیدا لە سەردەمی جەنگی باڵکان (١٩١٢-١٩١٣):

جەنگی باڵکان ئەو جەنگە بوو کە بە دوو قۆناغ ڕوویدا و تێیدا سوپای عوسمانیی بەرامبەر دەوڵەتانی باڵکان تووشی شکست هات. یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی دۆڕانی ئەم جەنگەش بریتی بوو لەو کێشە گەورانەی کە لە بابەتی دابینکردنی خۆراك بۆ سەربازان سەری هەڵدا. دەوڵەتی عوسمانیی لە حاڵەتی بێ توانایەکی زۆر گەورەدا چووە نێو جەنگەکەوە. سوپای عوسمانیی بەهۆی شەڕەکانی ١٨٧٧-١٨٧٨ عوسمانیی-ڕووسیی و پاشان جەنگی ١٨٩٧ عوسمانیی-یۆنانیی زۆر ماندوو ببوو، ئەم دۆخەش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ ئەوەی لەڕووی لۆجستیەوە بە لاوازیی بچێتە نێو جەنگ.[٥٩] هەرچەندە لە سەردەمی تەنزیمات هەوڵدرا بە سوود وەرگرتن لە ئەزموونی سوپای دەوڵەتانی ئەوروپا سوپای عوسمانیی

بە مۆدێرن بکرێت، بەڵام نەتوانرا ڕێکخستنێکی لۆجستی بەهێز دروست بکرێت. دوای ئەوەی دەوڵەت دابینکردنی تەواوی پێداویستییەکانی یەکە سەربازییەکانی[٦٠] گرتە ئەستۆ، هەڵسا بە زیادکردنی فەرمانبەری (نانەوای گەڕۆك) بۆ ڕێکخستنەکان، بۆ ئەوەی یەکە سەربازییەکان سوود لە دامەزراوە لۆجستییەکان وەربگرن، کە لە شێوەی چەند سوپایەك داڕێژرابوون. لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی کەموکوڕیی لە یەکەکانی تەکنیك و کارگێڕییدا خزمەتگوزاریی دابینکردنی خۆراك لە جەنگی بالکاندا لە ئاستێکی باشدا نەبووە.[٦١]

لە سەردەمی سەرەتاکانی سوپای عوسمانییدا ڕێکخستنەکانی بنکە لە ڕێگەی فەرمان و حوکمەکانەوە بەڕێوە دەبران، دواتر لە ڕێگەی ڕێکخستنەوەی لۆجستی سوپاکان و لەچوارچێوەی یاسا دانراوەکان بەڕێوەبراون. لە ساڵی ١٩١١ ژەنەڕاڵ (فۆن دێر گۆلت[٦٢]) کە لە ڕیزی سوپای عوسمانییدا لە ئەرکدا بووە، بەشێك لە ڕێنماییەکانی ئەڵمانیای بەناونیشانی (نیزامنامەی خزمەتگوزاریی بنکە) وەرگێڕاوەو لەو ڕێگەیەوە بەرەو پێش برداوە.[٦٣] لەماوەی نەبوونی ئەو شێوازە بەڕێوەبردنەشدا گرنگیی زۆر بە خزمەتگوزارییەکانی بنکە دراوەو لە پلانی[٦٤] جەنگەکانیشدا هێڵ و بنەماکانی بنکە بەتایبەت دانراون.[٦٥]

ڕێکخستنەکانی بنکە کە لەمەوبەر لەلایەن ئەمینداره‌کانی بنکە[٦٦] بەڕێوەدەبران، لە جەنگی عوسمانیی-یۆنانی ١٨٩٧دا بەناوی ئەنجومەنی بنکە چالاکییەکانی خۆی جێبەجێ کردووە، دواتر بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی بڵاوکراوە لە ساڵی ١٩١١ لە هەر سوپا و فەیلەقێکی سەربەخۆدا پشکنەرێتیی تایبەتی بنکە دامەزراوە. دوای بڵاوکردنەوەی پەیڕەوی ناوخۆی خزمەتگوزاریی بنکە لەساڵی ١٩١١، یەکەمین جێبەجێکردنی[٦٧] سیستەمەکە لە جەنگی بالکاندا بووکە ئامانجەکەی بریتی بوو لە دابینکردنی تەواوی پێداویستییەکان.[٦٨]

بەگشتیی، یەکەی لۆجستی لە ناوچەی تایبەت بە خزمەتگوزاریی سوپا کارەکانی خۆی ئەنجامداوە، کە ئەویش بەشێك بووە لە گۆڕەپانی جەنگ و لە کۆتایی یەکە سەربازییە شەڕکەرەکاندا بوو. ئەو ناوچەیەی کە لە سەردەمی پێشووتردا پیشەوەرانی جۆراوجۆرو هونەرمەندان بەناوی ئۆردوجو(ئێهلی هیرەف) تێیدا جێگیردەبوون بە (ناوچەی خزمەتگوزاریی سوپا) ناودەبردرا و وەك ناوچەی ڕاپەڕاندنی خزمەتگوزاریی لۆجستی دەناسرا. دوای ڕاگەیاندنی تەنزیماتیش ئەنجامدانی کارەکان خێراتر کران بۆ دەستنیشان کردنی ماددە پێویست و بنچینەییەکانی[٦٩] یەکە سەربازییە نوێیەکان. لەکاتی هەژمارکردنی ماددەی پێویست بۆ خۆراکی ڕۆژانەی سەربازان، ماوەی بەپێ ڕۆیشتنی ڕۆژانە بە پێنج کاتژمێر لێکدراوەتەوە.[٧٠] بەگوێرەی (یاسای کاتیی خۆراك و دامەزراندنی سەربازان) بە بەرواری ١٨ سێپتەمبەری ١٩١٢، پشکی ئازوقەی بەرگەگر[٧١] بۆ هەر سەربازێك بۆ یەك ڕۆژ بەم شێوەیە دیاریکراوە:





| ئازوقەی بەرگەگر | |
|---|---|
| پێکسیمەت | ٥٥٠ گم |
| گۆشتی لە قوتووکراو | ٢٥٩ گم |
| سەوزەی شۆربا | ١٠٠ گم |
| شەکر | ١٠٠ گم |
| چا | ٣ گم |

خشتەی یەکەم: ئازوقەی بەرگەگر

هەرچەندە لە میانەی جەنگی بالکاندا جگە لە ئازوقەی بەرگەگر، بە هەندێك ئازوقەی یەدەگیش پاڵپشتی یەکە سەربازییەکانی گۆڕەپانی جەنگ کراوە، بەڵام بەهۆی کەموکوڕیی لە یەکەکانی خزمەتگوزاریی و پاڵپشتیدا نەتوانراوە لە شوێن و کاتی پێویستدا خۆراك بۆ ناوچەکانی جەنگ دابین بکرێت. سەفەربەرلیك لە ١ ئۆکتۆبەری ١٩١٢ ڕاگەیەنرا، دوای چەند ڕۆژ لە ١٨ ئۆکتۆبەری ١٩١٢ و لە ماوەیەکی کورتدا جەنگ دەستی پێکرد، دەوڵەتی عوسمانیی لە چوارچێوەی دوو هەڵمەتدا چووە ناو جەنگەکەوە، لە تراکیا بە سوپای ڕۆژهەڵات و لە مەقدۆنیاش بە سوپای ڕۆژئاوا.[٧٢]

هەر لەگەڵ دەستپێکی جەنگ گرفت لە بابەتی خۆراکی سەربازان سەری هەڵدا. سەرەڕای ئەوەی کۆگاکانی ناوچەی تۆپەڵبوونی یەکە سەربازییەکان پڕبوون لە گەنم و ژمارەیەکی زۆریش ئاژەڵی شیاو بۆ سەربڕین هەبوون، کەچی نەدەتوانرا خۆراك دابین بکرێت، ئەم دۆخەش لە نەزانیی دەستەی فەرمانبەران سەرچاوەی گرتبوو. هەروەها جگە لە شاری ئێدیرنە، نەتوانرابوو ئازوقەی پێویست بۆ ناوچەکانی تر ئەمبار بکرێت. عەبدوللا پاشای فەرماندەی سوپای ڕۆژهەڵات چەندین جار بە نامە فەرماندەیی گشتی ئاگادار کردووەتەوە لە هۆکاری کەموکوڕییەکانی دابینکردنی خۆراك، بەگوێرەی ئەوە: «بەهۆی ناشارەزایی فەرمانبەرانی کارگێڕیی بە ئەرکەکانیان، هیچ کات بەشێوەیەکی ڕێکوپێك خۆراك دابین نەکراوە، هیچ پێداویستیەك نەنێردراوە بۆ لێنانی ئەو ئاردو برنجەی کە نێردراوەتە ناوچەی جەنگ بۆ ئەوەی بدرێتە سەربازەکان، ئەو ئازوقەیەی کە لە ناوچەکەدا هەیە تەنها بەشی یەك هەفتە دەکات و بەهۆی ئەوەشەوە سوپا نەك بەدەستی دوژمن بەڵکو بەهۆی برسیەتییەوە تووشی کارەسات دەبێت.»[٧٣]

فەرماندەیی گشتی لەو فەرمانانەی کە دەربارەی دابینکردنی خۆراك دەری کردووە پلانی داناوە بۆ ئەوەی هەتا هێڵی هێرش بردن چێشتی گەرم بە سەربازان بدات، هەروەها ئازوقەی بەرگەگر بۆ سێ ڕۆژ و ئاوی پێویستیشیان بۆ دابین بکات و ئەو پلانەشی بە یەکە سەربازییەکان ڕاگەیاندووە. بەڵام لە ڕاستیدا بەهۆی کەموکوڕیی لەو ماددە خۆراکییانەی لە ئیستەنبوڵەوە دەنێردران هەر لە سەرەتای جەنگەوە نەتوانراوە هەموو کات چێشتی گەرم دابین بکرێت، تەنانەت نەتوانراوە پێدانی ئازوقەی بەرگەگری سێ ڕۆژەش دابین

بکرێت. بەهەمان شێوە لە بابەتی دابینکردنی ئاو کێشە دروست بووە، بەهۆی نەبوونی کوپەی ئاوی پێویست نەتوانراوە بە تەواوی دابین بکرێت و هەولدراوە بە ناردنی کوپەی ئاوی لە ئیستەنبولەوە کێشەکە چارەسەر بکرێت.[٧٤] گواستنەوەی مادده خۆراکییەکانی وەك نان، پێکسیمەت، جۆ، ئارد، برنج، پەتاتە، نیسك، گاز، مۆم، ڕۆن، شەکر، پیاز و خوێ لەلایەن پشکنەرێتی بنکەوە ڕێکخراوە و ئەنجام دراوە. هەرچەندە فەرماندەیی گشتی بە وردیی لەسەر بابەتی خۆراك وەستاوە، کەچی نەتوانراوە خزمەتگوزاریی خۆراك بەگوێرەی ڕێڕەوی سروشتیی خۆی ئەنجام بدرێت. تەنانەت ئەو کاتانەشی کە مادده خۆراکییەکان بەردەست بوون، کەموکوڕیی هەبووە لە بەگەڕی پێشکەشکردنی بە سەربازان.[٧٥] دەتوانرێت بگوترێت یەکێك لە هۆکارەکانی ئەو کەموکوڕییانە بریتی بوو لە ڕاهێنراونەبوون و ڕێکنەخستنی فەرمانبەرانی یەکە لۆجستیەکان کە تازە دامەزرابوون و بۆ یەکەمجار لە جەنگی بالکاندا ئەرکەکانیان بەجێ دەهێنا. لە قۆناغەکانی داهاتووی جەنگدا کێشەکان زیاتر بوون. بەهاتنی ١٥ دیسەمبەری ١٩١٢ هیچ برێکی خوێ لە ناوچەکانی جەنگ بوونی نەما. دەستکرا بە دابەشکردنی پەنیر بەسەر یەکە سەربازییەکان بە هەژمارکردنی ٥٠ گم بۆ هەر سەربازێك بۆ ئەوەی سوود لە خوێیەکەی نێوی وەربگرن.[٧٦] هەروەها لە دابینکردنی پێداویستیی ئاردیش گرفت دروست بوو، ئەندازەی نان لە ٩٦٠ گم کەمکرایەوە بۆ ٧٥٠ گم. لە ١٦ جانیوەری ١٩١٣ بەدواوە ئەندازەی نان بۆ هەر سەربازێك کەمکرایەوە بۆ ٤٥٠ گم. هاوکات خەڵکی شاریش کێشەی کەمی خۆراکیان تووش هاتووە.[٧٧] لەبەر ئەو هۆکارانە، بە ناچاریی ئەندازەی پشکی خۆراکی سەربازان کەمکرایەوە. بۆ نمونە سوپای ڕۆژهەڵات لە ناوچەی قایمکراوی ئێدیرنە لە ٣ جانیوەری ١٩١٣ توانیویەتی نانی ٦٠٠ گرامی بداتە هەر سەربازێك و لیستی چێشتی هەفتانەش بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

| رۆژ | بەیانی | ئێوارە |
|---|---|---|
| هەینی | شۆربای ئارد بە سرکە | ١٠٠ گم پەنیر |
| شەممە | ٦٠ گم پەنیر | ساوەری کولاو |
| یەکشەممە | شۆربای ئارد بە سرکە | ١٠٠ گم پەنیر |
| دووشەممە | ٦٠ گم پەنیر | پرپۆلەی پێکسیمەت |
| سێشەممە | شۆربای ئارد بە سرکە | ١٢٠ گم پەنیر |
| چوارشەممە | ٦٠ گم پەنیر | ساوەری کولاو |
| پێنج شەممە | ٦٠ گم پەنیر | ساوەری کولاو |

خشتەی دووەم: خواردنی هەفتانە بە بەرواری ٣ جانیوەری ١٩١٣[٧٨]

بەهۆی ئەم گرفتانەوە، لەچوارچێوەی پلانێکدا دەستکرا بە سەربڕینی هەموو جۆرە ئاژەڵێکی بەردەست و دابەشکردنی بەسەر سەربازان و خەڵکی پێویست. نان و خۆراکی سەربازان لە خشتەکەدا بۆ نانی ٤٥٠ گم کەمکرایەوە و گۆشتی بۆ زیادکرا. بەپێی فەرمانێکی





دەرکراو لە ٥ مارچی ١٩١٣، لەو ئاژەڵە بەردەستانەی کە ژمارەیان بۆ ٢٦٦١ سەر کەم ببووەوە ١٠٣٧ دانەیان سەربڕدران. لەو بەرواره پشکی نانی هەر سەربازێك بۆ ٣٠٠ گم کەمکرایەوە و لیستی چێشت و خواردنەکان بەم شێوەی خوارەوە جێبەجێکرا:

| رۆژ | بەیانی | ئێوارە |
|---|---|---|
| هەینی | ٩٠ گم پەنیر | ١٥٠ گم گۆشت |
| شەممە | ٩٠ گم پەنیر | ١٠٠ گم قاورمە |
| یەکشەممە | ٩٠ گم پەنیر | ١٥٠ گم گۆشت |
| دووشەممە | ٩٠ گم پەنیر | ١٥٠ گم گۆشت |
| سێشەممە | ٩٠ گم پەنیر | ١٠٠ گم قاورمە |
| چوارشەممە | ٩٠ گم پەنیر | ١٥٠ گم گۆشت |
| پێنج شەممە | ٩٠ گم پەنیر | ١٥٠ گم گۆشت |

خشتەی سێیەم: خواردنی هەفتانە بە بەرواری ٥ مارچی ١٩١٣[٧٩]

هەرچی سوپای ڕۆژئاوایە گرفتی زیاتری کەموکوڕیی خۆراکی بۆ دروست بووە. ناردنی ئازوقە بۆ ئەو سوپایە نزیکەی مەحاڵ بووە.[٨٠] لەبەرئەوەی نەتوانراوە بەشێوەیەکی ئاسایی خۆراك بۆ زۆرێك لە یەکە سەربازییەکان دابین بکرێت، لەجیاتی ئەوە پارەیان پێ دراوە. ئەم دۆخەش بووەتە هۆی ئەوەی سەربازان بۆ دابینکردنی خواردن لە گۆڕەپانی جەنگ دووریکەونەوە و لە باغ و باخچە و دوکان و فڕنەکانی ناوچەکە کۆببنەوە.[٨١] خەڵکەکەش خۆیان بۆ دۆزینەوەی خواردن زەحمەتیی زۆریان دەبینی، لەبەرئەوە ئەوانەشی کە لایەنگری تورکەکان بوون چوونە پاڵ لایەنی بەرامبەر.[٨٢] سوپای ڕۆژئاوا و فەیلەق و سەرکردایەتی کارگێڕیی فرقەکە هەروەك چۆن نەیاندەتوانی خۆراك دەستەبەر بکەن، بەهەمان شێوە نەیاندەتوانی ئیمکانیاتە بەردەستەکانیش بە شێوەی پێویست بەکاربێنن، ئەمەش بەهۆی بێ توانایی پشکنەرێتیی بنکەی سوپاوە بوو کە بەرپرس بوو لە دابینکردن و خۆراك.[٨٣]

ئەو گیروگرفتانەی کە لە دابینکردنی خۆراکی سەربازان ڕوویداوە لە بیرەوەریی فەرماندەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. یوزباشی (بەحریی سێلانیکی) کە فەرمانبەر بووە لە سوپای ڕۆژئاوا باس لەوە دەکات کە: سەرباری هەبوونی ئازوقە بۆ خۆراکی سەربازان لە کۆگاکاندا، کەچی ئەو ئازوقەیە بۆ یەکە سەربازییەکان نەنێردراوە، سەربازان بە برسیەتی جێهێڵراون لەکاتێکدا بە ئەندازەی چیاکان پێکسیمەت و خۆراك کەڵەکە ببوو لەو کۆگایانەی کە دوو کاتژمێر لە یەکە سەربازییەکان دوور بوون، بۆیە چەشتنی ئەو هەموو زەحمەتیە لەلایەن سوپایەك کە لەسەر خاکی خۆیدا شەڕ دەکات زۆر بە نامۆ دەبینێت.[٨٤] (زەکی پاشا)ی فەرماندەی سوپای ڤارداری سەر بە سوپای ڕۆژئاوا لە بیرەوەرییەکانیدا باس لەوە دەکات کە: لە شەڕەکانی ناوچەی یانیا سەربازان بەهۆی برسیەتیەوە نەیانتوانیوە ڕزگار بن، برسیەتی بووەتە هۆی زیادبوونی زیانەکان، فەرماندەکانیش هاوشێوەی سەربازانی یەکە کشاوەکان برسی بوون.[٨٥]

هەرچەندە عوسمانییەکان لەگەڵ فەرمانی تەنزیمات دەستیان کرد بە نوێگەریی لە زۆر لایەندا، بەڵام بەدرێژایی ٧٣ ساڵ تا دەگاتە جەنگی باڵکان لە بابەتی دابینکردنی خۆراکی سوپا و سیستەمی بنکەدا هیچ گۆڕانکارییەکیان نەکرد. پێش جەنگی باڵکان و لە کاتی ڕاگەیاندنی سەفەربەرلیکیشدا نەتوانرا ڕێکخستنەکانی بنکە بە مۆدێرن بکرێت، بۆیە دوای دەسپێکی جەنگ نەیتوانی وەك پێویست ئەرکەکانی بەجێ بهێنێت لە دابینکردنی خۆراك بۆ سەربازان.(٨٦) بەمەش دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لە جەنگی باڵکاندا هەردوو سوپای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەڕووی دابینکردنی خۆراکەوە ڕووبەڕووی زەحمەتییەکی زۆر بوونەتەوە. هەرچەندە لە چوارچێوەی ئامادەکارییەکانی جەنگدا گرنگی زۆر دراوە بە دووبارە ڕێکخستنەوەی بنکە، بەڵام دەتوانرێت بگوترێت کە بەهۆی دانەنانی کەسانی کارامە لەو ڕێکخستنەدا پرۆسەکە سەرکەوتوو نەبووەو لە بابەتی خۆراکی سەربازاندا کێشەی زۆر گەورە دروست بووە.

**خۆراکی سەربازان لە سوپای عوسمانیی لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانییدا (١٩١٤-١٩١٨):**

لەمیانەی جەنگی یەکەمی جیهانییدا لە هەرچوار لای دەوڵەت خەباتی زۆر و جەنگی توند ئەنجام دراوە. لێرەدا تەنها لەسەر دابینکردنی خۆراك لە هەردوو بەرەی چەناککاڵێ و قەفقاس دەوەستین، کە لەڕووی ستراتیژیی و سەربازییەوە گرنگی زۆریان هەیە.

دەوڵەتی عوسمانیی لە سەرەتا جەنگی یەکەمی جیهانییدا ناوچەکانی دەوڵەتەکەی دابەشکرد بۆ سەر چەندین ناوچەی دابینکەری خۆراك، ئەمەشی بەگوێرەی ناوچەکانی ئۆپەراسیۆنی سوپاکان ئەنجامدا. بەم شێوەیە ناوچەی دابینکەری خۆراکی هەر سوپایەك دیاریکرا. سوپاکان سەرەتا پێداویستییەکانیان لەو ناوچەیە دابین دەکرد کە وەك ناوچەی دابینکەر بۆیان تەرخان کرابوو.(٨٧) کاروباری دابینکردنی مادده خۆراکییەکان، دابەشکردن و پلاندانان لەلایەن سەرۆکایەتی فەرمانگەی پێداویستییەکان (Levazım Dairesi Başkanlığı) سەر بە وەزارەتی جەنگ ئەنجامدراوە. جگە لەو مادده خۆراکییانەی کە سوپاکان لە ناوچەکانی خۆیان دابینیان کردووە، سەرۆکایەتی فەرمانگەی پێداویستییەکانیش هەڵساوە بە دابینکردنی مادده خۆراکییەکانی وەك بەرهەمە شیرەمەنییەکان، سابون، گاز، شەکر، چا، قاوە، بوندق، ترێ، خورما، ڕۆنی زەیتون و بابەتە لە قوتوونراوەکان.(٨٨)

بۆ بەردەوام بوونی توانای شەڕکردنی سەربازان و پێدانی خۆراك بەشێوەیەکی تەندروست، لە ٢٥ سێپتەمبەری ١٩١٤ یاسای دامەزراندنی سەربازیی و خۆراك دارێژرا و ئەندازەی مادده خۆراکییەکانی ڕۆژانە و ئالیکی ئاژەڵانی بە ستاندارد کرد. وەك لەو تابلۆیەی خوارەوە دەردەکەوێت لە خۆراکی سەربازاندا ڕۆن، کاربۆهیدرات و کالۆری ڕۆژانە بە بنچینە دانراوە. بەو پێیەش ڕۆژانە هەر سەربازێك بڕی ٣١٤٩,٢٥ کالۆری پێ ڕەوا بینراوە.





| | گرام | چەوریی | کاربۆهیدرات | ئەلبومین | کالۆری |
|---|---|---|---|---|---|
| نان | ٩٠٠ | ٣,٩٦ | ٤٦٥,٥٤ | ٥٥,٣٥ | ٢١٥١ |
| گۆشت | ٢٥٠ | ٥,٤٧ | - | ٥٠,٠٧ | ٢٥٦,١٥ |
| ساوەر | ١٥٠ | ٠,٣٦ | ١١٧,١٥ | ١٢,٦٠ | ٥٤٤,٦٠ |
| ڕۆن | ٢٠٠ | ٢١,٠٩ | ٠,١٢ | ٠,١٨ | ١٩٧,٥٠ |
| کۆی گشتی | ١٥٠٠ | ٣١,٩١ | ٥٥٢,٨١ | ١١٨,٢٠ | ٣١٤٩,٢٥ |

خشتەی چوارەم: پشکی خۆراکی ڕۆژانەی سەربازان (٨٩)

لە کاتێکدا ئەگەر نەتوانرا یەکێك لەو مادده خۆراکییانەی نێو خشتەکە بدرێتە سەربازان، بۆ دابینکردنی کالۆری پێویست ئەم ڕێوشوێنانەی خوارەوە گیراونەتەبەر:

نان؛ لە کاتێکدا ئەگەر نەتوانرا بڕی ٩٠٠ گم نان وەك پشکی ڕۆژانەی سەرباز بدرێت، لەجیاتی ئەوە بڕی ٦٠٠ گم پێکسیمەت دەدرێت، ئەگەر جگە لە پێکسیمەت نەتوانرا ماددەی خۆراکی تر بدرێت ئەوا بڕی پێکسیمەت بۆ ١٠٠٠ گم زیاد دەکرێت. هەروەها بڕیاردراوە بۆ ڕێگەگرتن لە تێکچوونی پێکسیمەتی نێو کۆگاکان ڕۆژانە دوو جار لەجیاتی نان پێکسیمەت بدرێت، یانیش پێکسیمەتەکە لەشێوەی پرپۆلە(٩٠) ئامادە بکرێت و پێیان بدرێت.

گۆشت؛ ئەگەر نەتوانرا بەشێوەی تازە دابین بکرێت، ئەوا لەشێوەی قاورمە یان قیمە دەدرێت، بەو مەرجەی نیوەی لە گۆشتی مەڕ پێکهاتبێت. هەروەها دەکرێت گۆشتی بزنیش بدرێت بەو مەرجەی نرخەکەی لە نرخی گۆشتی مەڕ زیاتر نەبێت.

ساوەر؛ لە کاتێکدا کە نەتوانرێت بدرێت، لەجیاتی ئەوە برنج دەدرێت، ئەگەر نەتوانرا برنجیش بدرێت ئەو کاتە پەتاتە، گێزەر، سەوزەی ووشك، ئارتیشۆك، کەلەرم، سپێناخ، سلق، تورشی کەلەرم، شێلم، زەڵاتەی سەوز و سەوزەی لەقوتوونراو، لەو شوێنانەشی کە سەوزە دەست نەکەوتووە هەڕشتەی جۆ، کوسکوس، بڕوێش، ترخێنە، هەر جۆرێکی تری سەوزەی ووشك و لە قوتوونراو دەدرێت. ڕۆن؛ ئەگەر نەتوانرا بڕی ٢٠٠ گم ڕۆنی ڕۆژانە بدرێت، لەجیاتی ئەوە گۆشت بەڕۆنی تازە، ڕۆنی زەیتون، کلك یان بەز، شەکر، دۆشاو، قاوە، چا، نان، شیر، ماست و حەلوای تەحین دەدرێتە سەربازان.(٩١) بەپێی یاسای خۆراکپێدانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، بڕی ئەو کالۆریەی کە پێویستە سەربازێك لە کاتی جەنگدا وەری بگرێت بریتیە لە نزیکەی ٤٠٠٠ کالۆری. دیاریکردنی بڕی ٣١٤٩,٢٥ کالۆری ڕۆژانە بۆ سەربازان لە ساڵی ١٩١٤ بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی ئەوکاتە بە بڕێکی گونجاو دادەنرێت.

**خۆراکی سوپا لە بەرەی چەناککاڵێ**

بەرەی چەناککاڵێ یەکێکە لەو بەرانەی کە لە میانەی جەنگی یەکەمی جیهانییدا ڕێڕەوی جەنگەکەی گۆڕیوەو ئەنجامەکانیشی ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبووە لەو ئۆپەراسیۆنانەی کە لەسەردەمی دواتر ئەنجام دراون. خۆراکی سەربازان ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە سەرکەوتنی چەناککاڵێ. دەوڵەتی عوسمانیی کە خراپترین ئەزموونی لە جەنگی باڵکاندا بینی، نەیتوانی پلان

و ئامادەکارییەکان بەگوێرەی سەرچاوە و پێداویستییە بەردەستەکان ئەنجام بدات، بەڵکو بەگوێرەی پلانە خەیاڵییەکان ئەنجامیداوە. لە ساڵی ١٩١٥ نەیتوانی ئەو پێداویستییانە دیاری بکات کە سوپای پێنجەم پێویستی پێ دەبوو کە بەشداری لە ئۆپەراسیۆنەکەدا دەکرد، پێشوەختەش نەیتوانی بەپێی پلانێکی تۆکمە ئەمبارکردن ئەنجام بدات.[٩٢] بەڵام لە ساڵی ١٩١٦ پێداویستییەکانی سوپا هەژمارکراوەو بەبێ هیچ جۆرە تیکەڵی و پێکەڵییەك ڕێکخستنەکان ئەنجامدراون.[٩٣]

بەشێوەیەکی سەرەکیی لەو شەڕانەدا پاقلەمەنییە ووشکەکان خۆراکی سەربازانیان پێکهێناوە. شۆربای برنج، نۆك بە گۆشت، فاسۆلیا بە گۆشت، پاقلەی ووشك، پلاوی ساوەر، خۆشاو(میوەی کولاو لەگەڵ شیلە)، ترێی ووشك و چەرەزاتی وەك بوندق دراوە. (٩٤) لەو کاتانەی کە نەتوانراوە پاقلەمەنییەکان بەشێوەیەکی گونجاو لە کۆگاکاندا بپارێزرێن، چێشتەکان تێکەڵ بە مێروو بوون، بۆیە دەستەواژەی (پاقلە بە کرم) یان (پاقلە بە مێروو) لەنێو سەربازان زۆر بەربڵاوبووە و وەك ناوێك بۆ چێشتی پاقلە بەکار هێنراوە.[٩٥]

دەربارەی پێداویستیی گۆشت، ماوە ماوە بڕێکی کەمتر گۆشت دراوە. لەو کاتانەی کە کێشە دروست بووە بڕی دیاریکراوی گۆشتی ڕۆژانە لە ٢٥٠ گرامەوە بۆ ٦٢ و پاشان بۆ ٣١ گم کەمکراوەتەوە.[٩٦] ئەو کاتانەشی کە نەتوانراوە گۆشت بدرێت، لەجیاتی ئەوە خۆراکی وەك مریشك، ماسی قوتوو، ماسی تازە، هێلکە، پەنیری زەرد، پەنیری بەخوێ خۆشکراو، شیر و ماست، باسترمە و سجوق دراوە. بەڵام لەجیاتی گۆشت زیاتر قاورمە و خۆراکی قوتوو دراوە. بەرامبەر ⅓ ی پشکی ڕۆژانەی گۆشتیش دانەوێلەی وەك فاسۆلیای ووشك و نۆك یاخود سەوزەی تازە و ٨٦ گم برنج، ٢٠ گم خوێ، ٢٠ گم پیاز و ١٠ گم ڕۆن دراوە.[٩٧]

لە بەرەی چەناککاڵێ کێشەی زۆر دروست نەبووە لە دابینکردنی ٩٠٠ گم نانی ڕۆژانە بۆ سەربازان. ئەو کاتانەی کە نەتوانراوە فڕنەکان بخرێنەکار یانیش لەکاتی دروستبوونی کێشە لە گەیاندنی خۆراك بە شەڕڤانانی ڕیزی هەرە پێشەوە، لەجیاتی نان پێکسیمەت دراوە.[٩٨] بەڵام دۆخەکە لە بەرەکانی تر جیاواز بوو. لە ساڵی ١٩١٨ بڕی نان لە شام ٥٠٠-٦٠٠ گم، لە بەرەی فەلەستین ٣٥٠-٦٠٠ گم و هەرچی عێراقە ئەو ئەندازەیە بۆ ٣٠٠ گم دابەزیوە. بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە دابینکردنی خۆراك لە بەرەی چەناککاڵێ باشتر بووە لەچاو بەرەکانی تر. لە بەرەکانی تردا سەربازان بە کەمترین ئەندازەی پشکی ڕۆژانە خۆراکیان پێ دراوە.[٩٩]

یەکێك لە گەورەترین کێشەکان بریتی بووە لەوەی کە ناوچەکانی دابینکەر نەیانتوانیوە سەوزە و میوەی تازە دابین بکەن بۆ ئەو سوپایەی کە لە ئەستۆیان بووە. بارودۆخی جەنگ بەرهەمەکانی بەشێوەیەك کەمکردووەتەوە کە سەوزە و میوەی تازە نزیکەی بەهیچ جۆرێك نەتوانراوە بدرێت. ئەم دۆخەش بووەتە هۆی ئەوەی نزیکەی ڕێژەی ٥/١ ی سوپا تووشی نەخۆشی سکورڤی[١٠٠] ببێت.[١٠١] لە بەرامبەردا لە هەندێ ناوچەی تر کە بەرهەمهێنانی سەوزە و میوەی تێدا ئاسان بووە، بەردەست بوون، هەروەك ڕۆژنامەنووسی ئەمەریکی(ئارثەر پاول) کە بەنێو بەرەکانی تورکدا گەڕاوە باس لەوە دەکات کە سەربازانی دواوەی بەرەی جەنگ





لە نانی بەیانییدا چا، پەنیری بزن و نانی تازەیان خواردووە. لە نانی ئێوارەشدا شۆربا، گۆشت، فاسۆلیای تازە و خۆشاوی ئالوباڵوویان خواردووەو پێشکەشی ئەویشیان کردووە.[١٠٢] هەرچی قاوە، چا و شەکرە لەو ماددە خۆراکییانە بوون کە بە زەحمەت دەست دەکەوتن و لەلایەن ناوەندەوە دەکڕدرا.[١٠٣] بەهۆی ئەوەی ئەو بەروبوومانە لە ڕێگەی هاوردەکردنەوە دابین دەکرا و دوای دەستپێکردنی جەنگیش هاوردەکردن تووشی وەستان هات، نرخەکانیان زۆر بەرز بوونەوە.[١٠٤]

یەکێکی دیکە لە کێشەکانی بەردەم خۆراکی سەربازان بریتی بوو لە لێنانی چێشت و گەیاندنی چێشتی گەرم بەو یەکە سەربازییانەی لە هێڵی پێشەوە بوون. چێشتخانە گەڕۆکەکان کە بە (مەنجەڵی ڕەش) ناسرابوون، بەهۆی ئەو دووکەڵەی دروستیان دەکرد لەوپەڕی دواوەی بەرەکان دادەمەزران. گواستنەوەی چێشتە لێنراوەکانیش لە ڕێگەی ئاژەڵەوە بۆ هێڵی پێشەوە دەبووە هۆی ڕژان و لەدەستدانی چێژی چێشتەکە، هەروەك کاتی نانخواردنیش تێکچووە.[١٠٥] بەتێپەڕبوونی کاتیش شەڕەکان گۆڕاون بۆ شەڕی سەنگەر و بەمەش گەیاندنی چێشتی گەرم بۆ هێڵەکانی پێشەوە زیاتر زەحمەت بووە. هەوڵدراوە ڕۆژانە یەکجار چێشتی گەرم بدرێتە سەربازەکان.[١٠٦] کەرەڤانەچیەکانی یەکە سەربازییەکان بەسوود وەرگرتن لە تاریکایی نیوە شەو لە پشتەوەی بەرەی جەنگەوە چێشتیان هێناوە.[١٠٧] چێشتەکان کە لە پشتەوەی بەرەکانی جەنگ لێ دەنران زۆربەی لە نێو سندوقی دار بە سەربازەکان دەگەیەنرا.[١٠٨] (وەهیب پاشا) کە فەرماندەی گروپی باشووری جەنگ بوو، لە تەلەگرافنامەیەك کە بۆ فەرماندەیی گشتی ناردووە، دەربارەی پشکی ڕۆژانەی سەربازان ئەم زانیارییانەی گواستووەتەوە: «نمونەی یەکێك لەو نانەتان بۆ دەنێرم کە دەدرێتە سەربازان. هەرچی ئەو ماددە خۆراکییانەشە کە بەناوی چێشت دەدرێت؛ بریتیە لە پاقلەی ئەوپەڕی کۆن و هەندێکجار کرمدار، لەگەڵ بە تێکڕا ٢٠ تا ٢٥ گرام گۆشتی گا بۆ هەر سەربازێك.» لەو جەنگە چروپڕانەشدا پشکی خۆراکی ڕۆژانەی سەربازان بە تەواوی کەمکراوەتەوە.[١٠٩]

(ئیبراهیم ناجی) کە وەك مولازمی دووەم لە بەرەی چەناککاڵێ لە ئەرکدا بووەو لەو میانەیەشدا شەهید بووە، لە دەفتەری یادەوەرییەکانیدا کە لەساڵی ٢٠١٩ بڵاوکراوەتەوە، زانیاریی گرنگی باسکردووە دەربارەی خۆراکی ڕۆژانەی سەربازان. ئیبراهیم ناجی دەربارەی خۆراکی سەربازان باس لەوە دەکات کە کێشەیان نەبووەو دەڵێ؛ «هەرچی خۆراکە زۆر نایاب بوو، جاری وا هەبوو سەرباز سێ جار نانی دەخوارد.» هەروەها باس لەوە دەکات کە چێشتەکان لە پشتەوەی بەرەی جەنگ بەڕێگای تەسك و بە پشتی گوێدرێژ هێنراون، کێشەکانیش لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە کە بەهۆی بۆردومانەکانەوە ماوە ماوە نەتوانراوە چێشتی گەرم بگەیەنرێتە سەربازان، لەبەرئەوە سەربازان سکاڵایان کردووە لە ساردیی چێشتەکەیان. ئەو زانیارییانەشی دەربارەی خشتەی خواردنەکان داویەتی جیاوازیی نیە لەگەڵ ئەوەی لە توێژینەوەکەماندا خراوەتەڕوو. باسی لەوە کردووە کە لە بەرەکاندا پلاو، فاسۆلیا، نۆك، پرپۆلە، پاقلە، خۆشاو و خۆراکی لەقوتوونراو دراوە، لە زۆربەی چێشتەکانیشدا گۆشت هەبووە.[١١٠]

دەتوانرێت ئەوە بگوترێت کە؛ هەرچەندە بەگشتی وا بڵاوبووەتەوە لەبەرەی چەناکاڵێکدا گێروگرفتی زۆر گەورە هەبووە لە دابینکردنی خۆراکی سەربازان، بەڵام لەڕاستیدا کێشەی زۆر ڕووی نەداوەو سەربازانیش بە برسێتی نەماونەتەوە و گرنگی دراوە بە دابینکردنی چێشتی گەرم و نان. ئەوە نەبێت کە لە میانەی شەڕی سەنگەرەکاندا کێشە هەبووە لە گەیاندنی چێشتی گەرم.

**خۆراکی سوپا لە بەرەی قەفقاس:**

پێشتر باسمان لەوە کرد کە لەسەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانییدا دەوڵەتی عوسمانیی ناوچەکانی وڵاتەکەی بەگوێرەی ئۆپەراسیۆنی سوپاکان دابەش کرد و ناوچەکانیش بەرپرس بوون لە دابینکردنی خۆراك بۆ ئەو سوپایەی لە ئەستۆیان بووە. بەگوێرەی ئەو ڕێکخستنە سوپای سێیەم کە ئەرکی بەرەی قەفقاسی پێ سپێردرابوو، ناوچەی دابینکەری خۆراکی بۆ دابینکرابوو، بەڵام لەماوەی ئاشتییدا هیچ ئامادەکارییەکی بۆ نەکرابوو.[١١١] لە چوارچێوەی ئامادەکارییەکانی جەنگدا لە سیواس ٣٠ تا ٤٠ هەزار کەس کۆبووبوەوە، تەنانەت بەبێ ئەوەی ٪ ی ئەو ژمارەیەش بێن، کێشەی دابینکردنی نان سەری هەڵدا. هەروەك هەندێك ڕۆژ هیچ نانێك نەدراوەتە یەکە سەربازییەکان، جاری وا هەبووە نەتوانراوە قاپێك شۆربا و چێشتێکی گەرمیش بدرێت. دواتر بە تێپەڕبوونی کات توانرا تا ئەندازەیەك پێداویستیی نان دابین بکرێت.[١١٢]

لەو بەرەیەدا ناوچەکانی دابینکەری خۆراك لە ئاستی پێویستدا نەبوون و هەر لە سەرەتای جەنگەوە کێشەی زۆر گەورە لە کاروباری دابینکردنی خۆراکدا دروست بوو. لەو ڕووەوە پێکهاتەی زەوی و بوونی شاخە سەختەکان لە ناوچەی ئۆپەراسیۆندا کاریگەریی زۆر خراپیان هەبوو. لە دەسپێکی جەنگدا هیچ داتایەك بەردەست نەبوو دەربارەی ئەندازەی ئەو ماددە خۆراکییانەی لە ناوچەکەدا هەبوون، بۆیە هیچ زانیارییەکی دروست لەو بارەوە نەبووە. تەنیا ئەو کاتە زانیارییەکان ڕوون بوونەتەوە کە دەستکراوە بە هەوڵدان بۆ دابینکردنی ئازوقە. لەبەرئەوە پڕۆگەیەکی دروست نەبووە دەربارەی بارودۆخی خۆراکی یەکە سەربازییەکان.[١١٣] هەر کاتێکیش پرسیار کرابێت لە یەکە سەربازییەکان، وەڵامی جیاواز دراوەتەوە و هەموو کات بە کەمترین ژمارە ئەندازەی ئازوقەکانیان نیشان داوە، دەستەواژەی بە برسێتی مانەوەو بە فریاکەوتن ئەوەندە زۆر بەکارهێنراوە کە نەتوانراوە بەڕاستی و دروستی یەکەی برسیی دیاریی بکرێت.[١١٤]

لەکاتی بەفر بارین و هەلومەرجی سەختی زستان لە ناوچەی بەدلیسدا لەجیاتی گالیسکە(عەرەبانە) ئاژەڵ بەکارهێنراوە. بۆ بردنی ئازوقەی زیاتر بۆ بەرەی جەنگ، ئازوقە لە پشتی ئاژەڵان بارکراوەو مرۆڤ و گالیسکەش بەکارهێنراوە.[١١٥] بۆ نمونە لەساڵی ١٩١٤ فەیلەقی یازدەم لە شەڕی کۆپروکۆی بێ ئازوقە مانەوەو هۆکارەکانی گواستنەوەشیان وەك پێویست نەبوو، بۆیە خەڵکی ئەرزەرۆم، کە زۆربەیان لە قوتابیانی ئامادەیی پێکهاتبوون، ١٥٠ هەزار کیلۆ ئاردیان لە فەردەی ٣٠ کیلۆیی بە پشت گواستەوە.[١١٦] هەروەها لە





ناوچەکانی ئەرزەرۆم، حەسەن قەڵا و کۆپروکۆی بەهۆی داخرانی ڕێگاکان گالیسکەکان نەیاندەتوانی تێپەڕن، بۆیە هەوڵدراوە بە پشتی مرۆڤ ئازوقە بگوازرێتەوە.[١١٧]

بەشێوەیەکی فەرمی و بەدرێژایی ماوەی جەنگ پشکی ڕۆژانەی سەربازان بە گوێرەی (نیزامنامەی سەفەربەرلیك و یاسای کاتیی دامەزراندنی سەربازان و خۆراك) دیاریکراوە. سەربازە لێهاتووەکانی نێو یەکە سەربازییەکان هەڵدەستان بە ئامادەکردنی ماددە خۆراکییەکان بەگوێرەی پشکی سەربازان و بەسەریاندا دابەشیان دەکرد. هەرچی نانە، لەلایەن بەشی نانەوای گەڕۆکی یەکە سەربازیەکان بەگوێرەی ستاندارده دیاریکراوەکان ئامادە دەکراو دەبرژێنرا، لەکاتی پێویستدا سوودیان لە فڕنەکانی ناوچەکەش وەردەگرت. بۆ دابینکردنی پێداویستیی گۆشت، لە ناوچەکانی نزیك یەکە سەربازییەکان ڕۆژانە ئاژەڵ سەردەبڕدرا.[١١٨] بوونی کارگەی لە قوتوونان لە وڵاتدا کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر خزمەتگوزاریی دابینکردنی خۆراك. فاسۆڵیا و بامیە ووشك کراونەتەوە. لە گەنم جۆرێك لە ساوەر دروستکراوە. ساوەر، برنج و سەوزەی ووشك لەجیاتی لە قوتوونراوەکان دراوە. دوای برژاندنی قاورمە لە نێو ڕۆن، لەنێو تەنەکەدا پارێزراوە. بەهۆی ئەوەی تەنەکە لە ناوخۆی وڵاتدا دروست نەکراوە، سوود لە تەنەکەکانی گازی (باکۆ) وەرگیراوە. ئەو تەنەکانەش بە ئەندازەیەکی سنووردار بەردەست بوون بۆیە نەتوانراوە بە ئەندازەی پێویست قاورمە دروست بکرێت.[١١٩]

بە قوڵتربوونی گۆڕەپانی ئۆپەراسیۆنەکان مەودای هێڵەکانی دابینکردنیش درێژتر بوون و لە کۆگاکان دوورکەوتنەوەو بە تێپەڕبوونی کات دابینکردنی خۆراکی سەربازان خراپتر بووە. بەهۆی کەمبوونەوەی ئەو ئازوقەیەی کە لە دواوە دەهات، خۆراکی یەکە سەربازییەکان بە زەحمەت کەوت.[١٢٠] دوای بارینی بەفرێکی زۆر لە کەشی زستاندا، قۆڵەکانی گواستنەوە لە ڕێگا تەنگەبەر و تەسکەکاندا تێکدەگیران و نەیاندەتوانی لە هەمان کاتدا تێپەڕ بین و ناچاربوون چاوەڕێی یەکتر بکەن، ئەم دۆخەش بووە هۆی کەم بوونەوەی توانای گواستنەوەی ڕۆژانە.[١٢١]

بارودۆخی فرقەی ٣٣یەم کە لە ئۆپەراسیۆنی سارێکامش بەشداربوو، جیاوازیەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ ئەوەی لە ڕۆژنامە سەربازییەکاندا هاتووە. لەو ڕاپۆرتەی کە هەر لە سەرەتای جەنگەوە نووسراوە باس لەوە کراوە کە قۆڵی ئازوقە وەك پێویست نیە، بە هۆکاری وەك خراپی پێکهاتەی ڕووی زەوی ناوچەکە نەتوانراوە لە دواوەی بەرەی جەنگ بە ئەندازەی پێویست خۆراك بۆ سەربازان بنێردرێت. لە کاتی دەستپێکردنی ئۆپەراسیۆنەکەدا تەنها ئازوقەی چوار ڕۆژ لای سەربازان هەبووە کە بریتی بووە لە نانی ووشك و زەیتون.[١٢٢] لە ڕۆژی ٢٣ سێپتەمبەری ١٩١٤ بەشێك لە سەربازان تەنها نانیان خواردووە، بەشێکی زۆر کەم لە سەربازەکان توانیویانە چێشتی گەرم بخۆن.[١٢٣] لە بەرواری ٩ ئۆکتۆبەری ١٩١٤ بەزەحمەت توانراوە تەنها نانیان پێ بدرێت و بەهۆی نەبوونی جۆوە ئاژەڵانیش بە برسێتی ماونەتەوە.[١٢٤] وەك لە ڕۆژنامەکانی جەنگدا دەبینرێت فرقەی ٣٠یەمیش کە بەشدار بووە لە ئۆپەراسیۆنەکە بە هەمان شێوە کەموکوڕیی زۆری هەبووە لە دابینکردنی خۆراك. فەوجی

